## دیوانی

# سوڵتانی ئەوینداران

# (ئیبن فارض)



**وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**

**ئەکادیمیای زانستی کوردی**

**ناوی کتێب : سوڵتانی ئەوینداران (ئیبن فارض)**

**وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**

**ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی**

**ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٤**

ئـەكـاديـمـيـاى زانـسـتـى كـوردى
Kurdish Science Academy

# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

**اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصــفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحـبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً**

**ئەم دیوانەیە بریتیە لە بەشێک لە شیعرە جوانەکانی سوڵتانی ئەویندارانی حەزرەتی شێخ ئیبن فارض ، کە هەندێک خەڵک کاتێک دەیخوێننەوە وادەزانن بۆ خۆشـەویستی نێوان دوو ڕەگەز دانرابێت ، بەڵام لەڕاسـتیدا هەمووی لە خۆشـەویسـتی و ئەویندارى خودای گەورە دانراوە ، مەبەسـتی شـاعیر لە ناو دێڕەکاندا زۆر قوڵترە لەوەی بە ڕووکەش مانای بکرێت ، بەڵام هەوڵمـانـداوە ڕوونترین وەرگێڕانی بۆ بکەین تـاکو خوێنەری کوردی بێبەش نەبێـت لە بەرهەمەکانی ئەم زاتە کە شـعرەکانی هەتا ئێسـتاش دیوان و تەکیە و خانەقاکانی سـۆفی و دەروێشانی گەرمکردووە و پڕکردووە لە ئەویندارى خودایی ...**

**هەژیر**

## پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ ئیبن فارض

ئەبـو قاسـم شـەرەفەدین عـومەری کـوڕی عەلـی کـوڕی مرشـد کـوڕی عەلـی حەمەوی میسـڕی ناسـراو بە ئیـبن فـارض یەکـێکە لە شـاعیرەکانی ئەهلـی تەسـەوف و نازنـاوی (سـلطان العاشـقین – یـاخود سـوڵتانی ئەویندـاران)ی لـێ نـراوە ، لە شـعرەکانیدا فەلسـەفەی یەکبـوونی هەبـوون بەدی دەکرێـت ، کە ئەو فەلسـەفەیە مەبەسـت لێـی ئەوەیە کە بـوونی ڕاسـتەقینە تەنهـا هەبـوونی خـودایە و بـونی بـونەوەران شـتێکی ڕەهـایی و لەنـاوچووە ، بـاوکی ئیـبن فـارض لە سـوریاوە دێـت بـۆ میسـڕ و نیشـتەجێی دەبێـت ، دوای ئەوەی کە پـلەو پۆسـتێکی وەهـای وەرگـرت کە فەرمـان بەسـەر خەڵکـدا بکـات بـۆیە نازنـاوی فارضـی لـێ نـراو و کـوڕەکەی کە عـومەر بـوو ئەمیـان ناسـرا بە (ئیـبن فـارض) ، عـومەر لە میسـڕ لەدایکبـوو و سـەرقاڵی فیقهـی مەزهەبـی شـافیعی بـوو و زانسـتی فەرمـوودەی لە ئیـبن عەسـاکر وەرگـرت ، پاشـان ڕێگـای سـۆفیگەری گـرتەبەر و دەسـتی کـرد بە دونیانەویسـتی و ڕووکـردنە خـودا ، هەربـۆیە دەچـووە مـزگەوتە چـۆڵ و تێکچووەکـانی قـاهیر و لێـواری شـاخەکان ، پاشـان بـۆ عەمـرە دەچێـت بـۆ مەکـکە و لەوێ زۆر نـوێژ دەکـات لە پـاڵ کەعـبەدا ، لە کاتەکـانی تریشـی لەوێـدا دوورەپەرێـزی هەڵـدەبژێرێت لە

خەڵــــک لە شـــــیوێکی دوور لە مەکــــــکە و لەو شـــــوێنە زۆرترینــــــی شــــــیعرەکانی دەنوســـــێت ، دەشـــــوترێت هۆکــــاری ڕۆیشـــــتنی بـــــۆ مەکــــــکە و مــــــانەوەی لەوێ دەگەڕێـــــتەوە بـــۆ ئامۆژگـــاری یەکێـــک لە مامۆســـتاکانی کە شـــێخ ئەبـــو حەســـەنی بەقـــاڵ بـــووە و پێـــی وتـــووە کە ئەگەر بچێـــت بـــۆ ئەوێ نهێنـــی زۆر گەورەی بـــۆ دەردەکەوێـــــت ، دوای پــــانزدە ســــاڵ دەگەڕێـــــتەوە بـــــۆ میســــــڕ ، لە هـــــۆڵی وتـــاربێژانی ئەزهەر دەمێنێـــــتەوە و خەڵــــک ســــەردانی دەکەن ، تەنــــانەت پادشــــا کــــاملی ئەو ســــەردەمەش ســــەردانی دەکــــات ، شـــێوەیەکی جـــوان و ڕێکـــوپێکی هەبـــووە و خـــاوەن شــکۆ و پـــایەبەرزی بـــووە ، خـــۆش گوفتـــار و شـــیرین دیـــدار بـــووە ، زمـــان پـــاراو و دەســـت کـــراوە و دڵفـــراوان بـــووە ، حەزی دەکـــرد لە شــەواندا ســەیری ئـــاوی ڕووبـــاری نیـــل بکـــات ، جبـــران خەلیـــل جبـــران دەڵێـــت کەوا ئیـــبن فـــارض لە پـــێگەی نێـــوان هەردوو شـــاعیر مـــوتەنەبی و مـــوعەری یە ، ئەو ســـەردەمی ئیـــبن فـــارض تێیـــدا ژیـــا بریتـــی بـــوو لە ســـەردەمی گـــۆڕینی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی لە دەوڵەتی فاتمی بۆ دەوڵەتی ئەیوبی

## شیعری یەکەم : أخفي الهوى و مدامعي تبديه

أُخفِي الهَوَى وَمَدَامِعِي تُبْدِيهِ

وَأُمِيتُهُ وَصَبَابَتِي تُحْيِيهِ

حەز و ئارەزووەکانم دەشارمەوە بەڵام فرمێسکەکانم بەدەری دەخات

حەز و ئارەزوەکانم دەمرێنم بەڵام پەرۆشی و بەجۆشیم زیندووی دەکاتەوە

وَمُعَذِّبِي حُلْوُ الشَّمَائِلِ أَهْيَفٌ

قَدْ جمعتْ كلُّ المَحَاسِنِ فِيهِ

ئەو کەسەی ئازارم دەدات خاوەن ئاکاری جوانە

هەموو شتە جوانەکان تێیدا کۆبوونەتەوە

فكأنهُ فِي الحُسْنِ صُورَةُ يوسفٍ

وكأنني فِي الحُزنِ مِثْلُ أبيهِ

دەڵێیت لە جوانیدا ئەو لە وێنەی یوسفە

منیش لە خەمدا وەکو باوکیم

يا حارقا بالنار وجه محبه

مهلا فإنّ مدامعي تطفيهِ

ئەی سوتێنەری ڕووی خۆشەویستەکەی بە ئاگر

بوەستە ، فرمێسکەکانم ئەو ئاگرە دەکوژێنێتەوە

أحرق بها جسدي و كل جوارحي

واحرص على قلبي فإنك فيهِ

وەرە هەموو جەستەم بسوتێنە لەگەڵ ئەندامەکانی

بەتایبەتیش جەخت بخەرە سەر دڵم چونکە تۆی تێدایت

إن أنكر العشاق فيك صبابتي

فأنا الهوى و ابن الهوى و أبيهِ

ئەگەر عاشقان جۆش و خرۆشی منیان ڕەت کردەوە

ئەوا من حەزپەرستم ، لەحەز بووم و ئەویش لە منە

## شیعری دووەم : لم أخش و أنت ساكن أحشائي

لَم أَخشَ وأنتَ ساكِنٌ أَحشائي

إِن أَصبَحَ عَنِّي كُلُّ خِلٍّ نَائي

فالنَّاسُ إِثنانِ وَاحِدٌ أعشَقُهُ

وَالآخَرُ لَم أَحسَبهُ في الأَحياءِ

بۆچی بترسم لەکاتێکدا تۆ لە ناخمدا بوونت هەیە

ئەگەر هاتوو هەموو هاوڕێکانم پشتیان تێ کردم

خەڵک دوو جۆرن یەکێکیان ئەویندارى بوومە

ئەوەی تریشیان ئەوەیە کە لە زیندووەکان نەم ژماردووە

## شيعری سێهەم : قد راح رسولي و كما راح أتى

قد راحَ رسُولي وكما راحَ أَتَى

باللَّهِ مَتى نَقَضْتُمُ العَهْدَ مَتى

ما ذا ظنّي بِكُمُ ولا ذَا أَملي

قَد أَدركَ فِيَّ سُؤلَه من شَمِتَا

**ئەو پەیامبەرەی ناردم (لێرەدا واتا دڵم) وەک چۆن ڕۆیشت گەڕایەوە**

**سوێندتان دەدەم کەی پەیمانتان شکاندووە کەی ؟**

**ئەوە هەرگیز گومانی من نەبوو بە ئێوە و لە ئێوەم چاوەڕێ نەدەکرد**

**کە ئاوا بیگەڕێننەوە بە دەستی بەتاڵ و پێداویستیەکەی جێبەجێ نەکەن**

## شیعری چوارەم : روحي للقاک یا مناها اشتاقت

رُوحي للقاك يا مُناها اشْتَاقَتْ

والأرضُ عليّ كاختيالي ضَاقَتْ

والنفسُ لَقَدْ ذابَتْ غراماً وجوىً

في جنب رضاك في الهوى ما لاقَتْ

**ڕووحم بۆ دیدارت ئەی مەبەستی ڕوحم زۆر تامەزرۆ بووە**

**زەویش تەنگ و تەسک بووە لەسەرم هاوشێوەی دڵم**

**خودیشم توایەوە لە خۆشەویستی و سوتا**

**لە پاڵ ڕەزامەندیبوونی تۆ لەکاتێکدا بەرامبەر ئەو حەز و ئارەزووانەی هەیبوو وای بەسەر نەهات**

## شیعری پێنجەم : خليلي إن جئتما منزلي

خليَليَّ إن جئُتما منزِلي

ولم تَجِدَاهُ فسيحاً فَسِيحا

وإن رُمْتُمَا منطِقاً من فَمي

ولم تسْمَعَاهُ فصيحاً فَصِيحَا

هاوڕێ و دۆستانم ئەگەر هاتنە ماڵەکەم

و بینیتان کە فراوان نییە ئەوا فراوانی بکەن

ئەگەریش ویستتان زانستێک لە زمانمەوە ببیستن

ئەگەر نەتانبیست بە ڕوونی و ڕەوانی ئەوکات دەتوانن هاوار بکەن

## شیعری شەشەم : یا لیلة وصل صبحها لم یلح

يا ليلةَ وصلٍ صُبْحُها لم يَلُحِ

مِنْ أَوَّلِها شربته في قَدَحي

لمّا قصُرَت طَاَلتْ وطَابَتْ بِلُقا

بَدْرٍ مِحَني في حُبِّهِ من منحي

ئەی ئەو شەوی بە دۆست گەیشتنە کە ڕۆژەکەی هەر هەڵنەهات

لە سەرەتای شەوەکەدا لە جامەکەمدا مەی پێکەیشتنم خواردەوە

کە شەوەکە کورت بووەوە درێژەی کێشا و بە پێکەیشتن خۆشتر بووەوە

کاتێک ماهێکی تابان دەرکەوت کە نەهامەتیەکانم لە خۆشەویستی ئەودا دیاری منن بۆی

## شیعری حەوتەم : روحي لک یا زائر في اللیل فدا

رُوحي لكَ يا زائرُ في اللّيْلِ فِدَا

يا مُؤْنِسَ وَحْشَتِي إذا اللّيْلُ هدى

إنْ كانَ فِرَاقُنا مع الصُبْحِ بَدَا

لا أسفَرَ بَعْدَ ذَاكَ صُبْحٌ أبدا

**ڕووحی من فیدات بێت ئەی ئەو کەسەی لە شەودا بەسەرم دەکەیتەوە**

**ئەی ئارامبەخشی تەنهاییم کاتێک شەو دادێت و دونیا بێدەنگ دەبێت**

**ئەگەر لەیەک جیابوونەوەمان لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر دەست پێ بکات**

**ئەوا هەرگیز جارێکی تر ڕۆژ ناکەمەوە لەدوای ئەو شەوە**

## شیعری هەشتەم : ما أطيب ما بتنا معا في برد

ما أَطْيَبَ ما بِتْنَا معاً في بُرْدٍ

إذْ لاصَقَ خَدَّهُ اعْتِنَاقاً خَدِّي

حتّى رَشَحَتْ من عَرَقٍ وجْنَتُهُ

لا زالَ نَصِيبِي مِنْهُ ماءُ الوردِ

چەندە خۆش بوو ئەوکاتەی پێکەبووین لە سەرمادا

ڕوومەتی نوساند بە ڕوومەتمەوە

هەتاکو هەندێک ئارەق لە ڕومەتی تکا

هەتا ئێستاش بەشی من لەو ئارەقە ئاوی گوڵاوە

## شیعری نۆیەم : زدني بفرط الحب فيک تحيرا

زِدْني بفَرْطِ الحُبّ فيك تَحَيّرا

وارْحَمْ حشىً بلَظَى هواكَ تسعّرا

وإذا سألُتكَ أن أراكَ حقيقةً

فاسمَحْ ولا تجعلْ جوابي لن تَرى

**بە زیادەڕۆیی لە خۆشەویستیدا زیاتر سەرسامم بکە**

**بەخشندەش بە لەگەڵ جەستەیەک کە بە حەز و ئارەزووی تۆ گڕی گرتووە**

**هەرکاتێکیش وتم با بە ڕاستیەتی تۆ ببینم**

**ئەوا ڕێگام پێ بدە و لە وەڵامدا مەڵێ (نامبینیت) {لێرە ئاماژەیە بۆ حەزرەتی موسا کە داوای بینینی خودای کرد و خودا فەرمووی (نامبینیت)}**

يا قلبُ أنتَ وعدَتني في حُبّهِمْ

صَبراً فحاذرْ أن تَضِيقَ وتَضجرا

إنَّ الغرامَ هوَ الحياةُ فمُتْ بِهِ

صَبّاً فحقّك أن تَموتَ وتُعذرا

**تائەی دڵ تۆ بەڵێنی خۆشویستنی ئەوانت پێداوم**

بۆیە ئارام بگرە و نەکەی تاقەتت بپڕوکێت یاخود تەنگ و تەسک بیت ئەی دڵ

خۆشەویستی بریتیە لە ژیان پێیەوە بمرە

بە گەنجی چونکە مافی خۆتە کە بمریت و بەهانەت هەبێ

قُل لِلّذِينَ تقدَّموا قَبلي ومَن

بَعدي ومَن أضحى لأشجاني يَرَى

عني خذوا وبي اقْتدوا وليَ اسمعوا

وتحدّثوا بصَبابتي بَينَ الوَرى

بڵێ بەوانەی پێش من کەوتوون و ئەوانەش

کەوا لەدوای من دێن و ئەوانەش کە بینەری گریان و فوغانم دەبوون

لە منی وەربگرن و شوێنم بکەون و گوێڕایەڵم بین

باسی خۆشەویستی و ئەوینەکەم بکەن لەناو خەڵکدا

ولقد خَلَوْتُ مع الحَبيب وبَيْنَنَا

سِرٌّ أرَقّ منَ النسيمِ إذا سرى

وأباحَ طَرْفِي نَظْرَةً أمّلْتُها

فَغَدَوْتُ معروفاً وكُنْتُ مُنَكَّرا

لەگەڵ یارەکەم بەتەنها ماینەوە و لەنێوانماندا

نهێنیەک هەیە کە لە شنەبا نەرمونیانترە کاتێک تێدەپەڕێت

چاوەکانم ڕێگەی دا کە دیدارێکم هەبێ کە چاوەڕوانیم دەکرد

بەو تێڕوانینە بووم بە کەسێکی ناسراو لەکاتێکدا پێشتر نەناسراو بووم

فَدُهِشْتُ بينَ جمالِهِ وجَلالِهِ

وغدا لسانُ الحال عنّي مُخْبِرا

سەرسام بووم بە جوانی و شکۆمەندیەکەی

زمانیشم بوو بە وەرگێڕی ئەو حاڵ و دۆخەی هەمبوو

فأَدِرْ لِحَاظَكَ في محاسنِ وجْهه

تَلْقَى جميعَ الحُسْنِ فيه مُصَوَّرا

لو أنّ كُلّ الحُسْنِ يكمُلُ صُورةً

ورآهُ كان مُهَلِّلاً ومُكَبِّرا

چاوەکانت بڕوانێنە بۆ جوانیەکانی ڕوخساری

دەبینیت هەموو جوانیەک لە ئەودا بوونی هەیە

ئەگەر هەموو جوانیەک وێنە و سیمایەک تەواو بکات

و ئەو ببینێت ئەوکات دەست دەکات بە هەڵهەڵە لێدان و بانگدان

## شيعرى دەيەم : عيني جرحت وجنته بالنظر

عَيْني جَرَحَتْ وَجْنَتَهُ بالنّظَرَ

من رِقّتِهَا فانْظُرْ لحُسْنِ الأثر

لم أجنِ وقد جَنيتُ وَرْدَ الخَفَر

إلاّ لترى كيفَ انشقاقُ القَمَرْ

چاوەكانم بە تێڕوانینێک ڕوومەتەکانی بریندار کرد

لەبەر ناسکیان ، ببینە چۆن شوێنەواری ماوە

تاوانم ئەنجام نەداوە ئەگەرچی وام لەو ناسک وەک گوڵئاسایە کردووە

تەنها بۆ ئەوەم بوو بزانم مانگ چۆن دووکەرت بووە

{لێرەدا شاعیر مەبەستی ئەوەیە بە تێڕوانینێک ڕومەتی یارەکەی بریندار دەکات و دەڵێت من تـاوانبـار نیم کە برینـدارم کردووە تەنهـا بۆ ئەوەی بووە بزانێـت کە لە قورئـانـدا بـاســـی دوکەرتبوونی مـانـک کراوە بە چـاو ببینێـت ، ئەمەش واتـا ڕومەتی بریـنـداری یـارەکەی هاوشێوەی مانگێکە کە دووکەرت ببێت}

## شیعری یانزدەهەم : ما أصنع وقد أبطأ علي الخبر

ما أصنَعُ وَقَدْ أَبْطَأَ عليّ الخَبرُ

وَيْلاَهُ إلى مَتَى وكَمْ أَنْتَظِرُ

كم أَحِمِلُ كم أكْتُمُ كم أصطَبِرُ

يُقْضَى أجلي ولَيْسَ يُقْضَى وَطَرُ

**چی بکەم لەکاتێکدا هەواڵەکەی چاوەڕوانیم دواکەوت و نەگەیشت**

**وای بە حاڵم هەتاکو کەی و تاکو چەندێک من چاوەڕوان ببم**

**چەند ئاستەنگی هەڵگرم و چەند داپۆشم و چەند ئارام بگرم**

**وا خەریکە دەمرم و هێشتا بەوە نەگەیشتووم کە دەمویست و داوام دەکرد**

## شیعری دوانزدەهەم : عوذت حبيبي برب الطور

عَوّذْتُ حُبَيّبي بربِ الطُورِ

من آفةِ ما يجري منَ المَقْدُورِ

ما قلتُ حُبَيِّبي منَ التحقيرِ

بل يَعْذُبُ اسمُ الشـيء بالتصغيرِ

**خودای کێوی طور با خۆشەویستەکەم بپارێزێ**

**لەو ناخۆشی و نەهامەتیانەی بڕیار وایە بەسەریدا بێت**

**ناڵێم خۆشەویستەکەم لە ڕووی ئەوەی بێنرخی بکەم**

**بەڵکو ناوی شتێک ئازار دەدرێت کاتێک بچوک دەکرێتەوە**

**{لێرەدا شـــاعیر مەبەســـتی لە خۆشـــەویســـتی نێوان خۆی و خوایە ، کە خۆی بە ناوی (خۆشــەویســتەکەم) دەردەبڕێت و خوداش بەناوی (خودای کێوی طور) ئاماژە پێ دەکات ، بەمەش خۆشــەویســتێکی بێدەســەڵات ئازاردەدرێت بەوەی بێدەســەڵاتە و لە ژێر پارێزگاری خودایە ، ئەمەش ئازاری خۆشەویستیە}**

## شیعری سیانزدەهەم : حديثه أو حديث عنه يطربني

حديثُهُ أو حَديثٌ عنْهُ يُطْرِبُنِي

هذا إذا غابَ أو هذا إذا حَضَرَا

كِلاَهُمَا حَسَنٌ عندي أُسَرُّ به

لكنَّ أحلاهُما ما وافَقَ النّظرا

**باسێک کە ئەو بیکا یاخود باسێک لە ئەوەوە بکرێت پەرۆشم دەکات**

**ئەگەر ئەمیان دیار نەبێت یاخود ئەویان ئامادە بێت**

**لە هەردوو حاڵەتەکە حەزم بەوەیە کە لەبارەی ئەوەوە دەیبیستم**

**بەڵام لەو دوانە خۆشترینیان ئەوەیە کە بتوانم بە چاو لێی بڕوانم**

**{شاعیر لێرەدا دەیەوێت ئاماژە بەوە بدات کە ئەگەر قورئان بخوێنێت کە فەرمایشتی خودایە یاخود لە دەمی کەسێکی ترەوە بیبیستێت ، ئەمانە هەمووی بەپەرۆشی دەکەن بەڵام ئەو حەز دەکات بە چاوی دڵ خودا ببینێت چونکە بەچێژترینە و ئەو ئاگری بەپەرۆشیە لە دڵیدا جێگیر دەکاتەوە)**

## شیعری چواردەهەم : كلفت فؤادي فيه ما لم يسع

كَلَّفْتُ فؤادي فيهِ مَا لم يَسعِ

حتّى يَئِستْ رَأفَتُهُ من جَزَعي

ما زِلتُ أقيمُ في هَوَاهُ عُذري

حتّى رجَعَ العاذل بِهَواه مَعي

**داوام لە دڵم کرد کە ئەوە لەناو خۆیدا جێبکاتەوە کە جێی نابێتەوە**

**هەتاکو بێهیوابوو سۆز و بەزەییەکەی بەرامبەر نائارامی من**

**ئێستاش هەر لە خۆشەویستی ئەودا ماومەتەوە**

**هەتاکو وای لێهات ئەوەشی لۆمەی دەکردم ئەویش خۆشی ویست**

## شیعری پانزدەهەم : عين نظرت إليک ما أشرفها

عَيْنٌ نَظَرتْ إليكَ ما أَشْرَفَهَا

روحٌ عَرَفَتْ هَواكَ ما أَلْطَفَهَا

چاوێک کە لە تۆ بڕوانێت چەندە پیرۆزە

ڕوحێک کە ئارەزوومەندی تۆ بێت چەندە نازدار و شرینە

## شیعری شانزدەهەم : أهوى قمرا له المعاني رق

أَهْوَى قَمَراً له المعاني رِقُ

منْ صُبْحِ جَبينِه أَضاءَ الشرقُ

تدري باللِه ما يقولُ البرقُ

ما بينَ ثَنَايَاهُ وبَيْنِي فرقُ

حەزم بە مانگێک کردووە کە شایەنی ئەوەیە ستایش بکرێت

چونکە ڕووی نێوچەوانی  بووەتە ئاوابوونی ڕووناکی و ڕۆشنایی

توخودا دەزانیت کە هەورەبروسکە چی دەڵێت ؟

دەڵێت لە نێوان من و جوانیەکانی ئەودا جیاوازی هەیە

## شیعری حەڤدەهەم : نسخت بحبي أية العشق من قبلي

نسخْتُ بِحَبّي آية العِشْقِ من قبلي

فأهْلُ الهوى جُندي وحكمي على الكُلّ

وكلُّ فَتىً يهوى فإنّي إمَامُهُ

وإني بَريءٌ من فَتىً سامعِ العَذْلِ

ئەو ئایەتانەی خۆشەویستی کە لە پێش مندا هەبووم ئەوە هەڵمگرت و لەبەرمگرتەوە

ئەویندارانن لەشکری منن و دەسەڵاتی من بەسەر هەموویاندایە

هەر کەسێک خۆشەویستی بکا من پێشەوایم

من بەدوورم لەو کەسەی تەنها گوێ دەگرێت و دوورەپەرێزە

ولي في الهوى عِلْمٌ تَجِلّ صفاتُهُ

ومن لم يُفَقّهه الهوى فهْو في جهل

ومن لم يكنْ في عِزّةِ الحبِّ تائهاً

بِحُبّ الذي يَهوى فَبَشّرْهُ بالذّل

لە خۆشەویستیدا زانستێکم هەیە کە جوان و ناوازەیە

ئەوەی لە خۆشەویستی تێنەگات ئەوە لە نەزانیدایە

ئەوەی لە شکۆداری خۆشەویستیدا ون نەبێت

لە خۆشەویستی ئەو کەسەی خۆشی دەوێت ئەوا مژدەی سەرشۆڕی پێ بدە

إذا جادَ أقوامٌ بمالٍ رأيْتَهُمْ

يَجودونَ بالأرواحِ مِنْهُمْ بِلا بُخل

وإن أودِعوا سِراً رأيتَ صُدورهم

قُبوراً لأسرارٍ تُنَزّهُ عن نَقلِ

ئەگەر کەسانێک پارە ببەخشن ، لەبەرامبەردا دەبینی ئەمانە

ئامادەن گیان و ڕووحیان ببەخشن بە بەخشندەییانە

ئەگەریش نهێنیەکی خودایی بخرێتە دڵیان ، دەبینیت کەوا

سنگیان دەبێتە گۆڕێک بۆ شاردنەوەی ئەو نهێنیە لە گواستنەوە و باسکردن

وإن هُدّدوا بالهَجْرِ ماتوا مَخافَةً

وإن أوعِدوا بالقَتْلِ حنّوا إلى القتل

لَعَمري هُمُ العُشّاقُ عندي حقيقةً

على الجِدّ والباقون منهم على الهَزْل

**ئەگەر هەڕەشەشیان لێ بکرێت بە لێکدابڕین لە ترسدا دەمرن**

**ئەگەریش مژدەی کوشتنیان پێ بدرێت ، دەگرین بۆ کوشتن**

**سوێند بە تەمەنم ئەوانە ئەویندارى ڕاستەقینەن لەلام**

**ڕاستگۆن و ئەوانەی تریش جگە لەمان سەرقاڵی شتی پڕوپوچن**

## شیعری هەژدەهەم : إن مت وزار تربتي من أهوى

إن مُتّ وزارَ تُرْبَتي من أَهْوَى

لبَّيْتُ مناجِياً بغيرِ النَجْوَى

في السر أقول يا تُرى ما صَنَعَتْ

ألحاظُكَ بي وليسَ هَذَا شَكْوَى

ئەگەر مردم و ئەوکەسە سەردانی گۆڕەکەمی کرد کە ئەویندارێم

ئەوا بەبێ هیچ گلەیی و گازندەیەک لە دڵمدا ، لە ناخم دەڵێم

ئایا تێڕوانینەکانی تۆ چی بەمن کردووە ؟ ، ئەمەش نە سکاڵایە و نە گلەیی

## شیعری نۆزدەهەم : إن جزت بحي لي على الأبرق حي

إن جزْتَ بحيّ لي على الأبْرَقِ حيْ

وابلِغْ خَبَري فإنني أُحْسَبُ حيْ

قُلْ ماتَ مُعَنّاكُمْ غراماً وجَوىً

في الحُبّ وما اعتاض عن الرّوح بشَي

ئەگەر بە سواری ئەسپەکەتەوە بە ناوچەیەکی من تێپەڕیت سڵاویان لێ بکە

و هەواڵی منیان بدەرێ چونکە پێم وایە هێشتا زیندووم

بڵێ مانا و مەبەستەکانتان مرد لە ناو ئەوینداری و سوتا لە خۆشەویستی

سەرەڕای ئەوەش ڕووح هیچ پەندێکی لەمە وەرنەگرت

## شیعری بیستەم : أهوى رشأ رشيق القد حلي

أَهْوَى رَشاً رُشَيْقَ القدّ حُلَيّ

قد حكّمَه الغَرامُ والوَجْدُ عَلَيّ

إن قُلْتُ خُذِ الرّوح يَقُلْ لي عَجَباً

ألرّوحُ لنا فهاتِ من عندِك شَيْ

ئەویندارى ئاسكێكى قەدوباڵا لاوازى ڕازاوەم

كە خۆشەویستى و خەم سەپاندوویانە بەسەرمدا

ئەگەر بڵێم وەرە ڕووحەكەم ببە ، ئەو دێت و بەسەرسامیەوە دەڵێت

ڕوحى تۆ هەر لە زووەوە هى ئێمە بووە ، شتێكى تر ببەخشە

## شیعری بیست و یەکەم : فطوفان نوح عند نوحي كأدمعي

فَطُوفانُ نوحٍ عندَ نَوحي كَأَدمُعي

وَإيقادُ نِيرانِ الخَليلِ كلَوعَتي

وَلَولا زَفيري أَغرَقَتنيَ أَدمُعي

وَلَولا دُموعي أَحرَقَتنيَ زَفرَتي

وَحُزني ما يَعقوبُ بَثَّ أقلَّهُ

وكُلُّ بِلى أيُّوبَ بعضُ بلِيَّتي

**لافاوی نوح لەکاتی گریە و زاریمدا هاوشێوەی فرمێسکەکانمە**

**ئاگرەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل هاوشێوەی ئەو ئاگرەیە کە لە ناخم گیرساوە**

**ئەگەر هەناسەدان نەبوایە فرمێسکەکانم دەیانخنکاندم**

**ئەگەر فرمێسکەکانیشم نەبوایە هەناسەکانم دەیانسوتاندم**

**ئەو خەم و خەفەتەی هەمە حەزرەتی یەعقوب کەمێکی لەوە نەچەشتووە**

**هەموو بەڵاکانی کە بەسەر حەزرەتی ئەیوبیش هات تەنها بەشێکە لە بەڵاکانی توشم بووە**

## شیعری بیست و دوو : وإن يكن فرط وجدي في محبتكم

وإن يكُنْ فرطُ وجدي في مَحَبّتِكُمُ

إثْماً فقد كَثُرَتْ في الحبّ آثامي

ولو علِمْتُ بأَنّ الحُبّ آخِرُهُ

هذا الحِمَامُ لَمَا خالَفتُ لُوّامي

أَودَعْتُ قلبي إلى مَن ليس يحفظُه

أبصرْتُ خلفي وما طالعتُ قدَّامي

لقد رَمَاني بسهمِ من لواحِظِهِ

أصْمى فؤادي فوا شوقي إلى الرامي

ئەگەر زیادەڕۆیی ئەوینداریم لە خۆشەویستیتان تاوان و خراپەکاری بێت

ئەوا من لە خۆشەویستیدا تاوان و خراپەکاریەکی زۆرم کردووە

ئەگەر بزانم کە کۆتایی ئەم خۆشەویستیە مردنە ئەوا هەرگیز پاشگەز نابمەوە

دڵم سپارد بە کەسێ کە نەیپاراست ، سەیری پشت خۆمم دەکرد و سەیری پێشەوەم نەدەکرد

بە تێڕوانینی تیرێکی هەڵدا کە جەرگ و هەناومی کرٍ تێبەردا ، ئای چەندە تامەزرۆی دیداری

تیر هەڵدەرەکەم

## شیعری بیست و سێ : ولو خطرت لي في سواك إرادة

ولو خطَرَت لي في سِواكِ إرادةٌ

على خاطري سَهواً قضيتُ بِرِدَّتِي

لَكِ الحُكم في أَمري فما شِئتِ فَاصنَعي

فَلَم تكُ إلّا فيكِ لا عَنكِ رَغبَتِي

**ئەگەر جگە لە ویســتی تۆ ویســت و داوایەک بە دڵمدا هات بەبێ ئاگایی ئەوا خۆم بە دەرچوو لەم ڕێگایە دادەنێم**

**بڕیار بەدەســـت تۆیە لە حاڵی مندا ، هەر شـــتێکت دەوێت ئەنجامی بدە ، تەنها لەبەر تۆیە و جگە لە تۆ هیچ ئارەزوویەکم نییە**

## شیعری بیست و چوار : أنتم فروضي و نفلي

أنْتُم فُرُوضي ونَفلي أنْتُم حَديثي وشُغْلي

يا قِبْلَتِي في صلاتي إذا وَقَفْتُ أُصلّي

جَمالُكُمْ نَصْبُ عَيني إليهِ وجّهْتُ كُلّي

وسِرّكُمْ في ضَميري والقلبُ طُورُ التّجَلّي

ئێوەن ئەو شتەی سەپێندراوە بەسەرم و پاداشت دەکرێم لە پێناویدا ، ئێوەن گوتار و باس و کارم

ئەی ڕووکەهی من لە نوێژەکەمدا کاتێک نوێژ دەکەم ، جوانیتان وا لە نێو چاوانمدا دەیبینم بۆیە ڕووی تێدەکەم ، نهێنیەکەتان لە ناخمدایە و دڵیش بووە بە کێوی طوری ســــوتاندن و دەرکەوتنی نوری خودایی تێیدا

آنسْتُ في الحَيّ ناراً لَيْلاً فَبَشّرْتُ أهلي

قُلْتُ امْكُثُوا فَلَعَلّي أجِدْ هُدايَ لَعَلّي

دَنَوْتُ مِنها فكانَتْ نارُ المُكَلَّمِ قَبلي

نودِيتُ مِنها جِهاراً رُدّوا لَيالِيَ وَصلي

لەو ناوچەیەی نیشـتەجێم ئاگرێکی گەورەم بینی لە شـەودا کە بەشـێوەیەک بوو مژدەم دا بە خزم و کەسوکارم

وتم ئێوە لێرە بمێنن و من بەرەو ڕووی ئاگرەکە دەڕۆم بەڵکو ڕێگا ڕاســـتەکەی دەمەوێت بیدۆزمەوە

کە نزیکبوومەوە بینیم ئاگری ئەو کەســـەیە کە پێش من دیداری لەگەڵ خودا هەبووە {لێرەدا وەک ئەوە وایە شـــاعیر بڵێ چومە ســـەر کێوی طور تا لەگەڵ خودا بدوێم ، بینیم پێش من سوتاوە چونکە کەسێکی تر پێش من گفتوگۆی لەگەڵ کردووە)

منیش لێی نزیکبوومەوە بە ئاشکرا تاکو بەڵکو بەو شەوە بگەم بە دیداری دۆستەکەم

حتى إذا ما تَدَانَى الميقَاتُ في جَمْعِ شملي

صارَتْ جِبالِيَ دكاً منْ هَيْبَةِ المُتَجَلّي

ولاحَ سرٌ خَفيٌ يَدْرِيهِ مَنْ كَانَ مِثْلي

کە نزیک بوومەوە لەو شوێنە و هەموو جەستەم ئامادە بوو ، بینیم شاخەکان داڕمان لە شان و شـکۆی دۆسـت و یارەکەم ، لەوکاتەدا کە شـاخەکان داڕمان نهێنیەکی شـاراوە دەرکەوت کە تەنها ئەوەی وەک من بێت دەزانێت چییە

وصِرْتُ مُوسَى زَمَاني مذ صارَ بَعْضِيَ علّي

فالموتُ فيهِ حياتي وفي حَياتيَ قَتلي

أنا الفقيرُ المُعَنّى رِقُوا لِحَالي وذُلّي

بووم به موسـای سـەردەمی خۆم کاتێک بەشـێکم که دڵمە زاڵبوو بەسـەر هەموو جەسـتەمدا ، مردن لەم خۆشـــەویســـتیەدا ژیانی منه و ژیانیشـــم تێیدا بریتیه له کوشـــتنم ، منم هەژاری جەفاکێش بەزەییەکتان بێتەوە بە دۆخ و داماویم

## شیعری بیست و پێنج : نشرت في موكب العشاق أعلامي

نَشَرْتُ في موكِب العشّاقِ أعلامي

وكان قَبلي بُلي في الحُبّ أعلامي

وسِرْتُ فيه ولم أبْرَحْ بدَوْلتِهِ

حتى وجَدْتُ مُلُوكَ العِشْقِ خُدّامي

**له کـاروانی ئەویـنـدارانـدا ئـاڵاکـانم بڵاو کردەوە ، پێش منیش ئـاڵاکـانم بووبوون بە داوی خۆشەویستیەوە**

**تێیدا ڕۆیشتم و هیچم نەدرکاند ، هەتاکوو بینیم پادشاکانی ئەویینداری بوونەتە خزمەتکاری من**

ولم أَزَلْ منذ أخذِ العهدِ في قِدَمي

لكَعْبَةِ الحُسْنِ تجريدي وإحرامي

وقد رَماني هواكُمْ في الغرامِ إلى

مَقامِ حُبٍّ شريفٍ شامخٍ سامِ

**لەو ڕۆژەوەی پەیمانم داوە {مەبەســتی شــاعیر لێرەدا پەیمان و بەڵێنی ئەلەســتە ، کە خودا فەرمووی : (الســت بربکم) (واتا : ئایا من خوداتان نیم؟) بۆیە هەموو ڕوحەکان پێکەوە وتیان**

**بەڵێ} ، ڕووم کردۆتە ڕووگەهی ئێوە و بۆتان کەمەندکێشـــم ، ئەوینی ئێوە منی خســـتە ناو خۆشەویستیەوە هەتاکو پلەیەکی خۆشەویستی پیرۆز کە وەک شاخ بڵندە و ژەهراویە**

## شيعرى بيست و شەش : سلكت كل مقام في محبتكم

سَلَكْتُ كُلّ مَقامٍ في مَحَبّتِكُمْ

وما ترَكْتُ مقاماً قطُّ قُدّامي

وكُنْتُ أحسَبُ أنّي قد وَصَلْتُ إلى

أعْلى وأغْلى مقامِ بينَ أقوامي

حتى بَدا لي مَقامُ لم يكُنْ أَرَبي

ولم يَمُرّ بأفكاري وأوهامي

**هەموو پلە و پێگەیەكم لە پێناوتاندا گرتەبەر و هیچ پلەیەكم لە بەردەمم نەهێشتەوە**

**وامدەزانی گەیشتووم بە بەرزترین و پایەدارترین پلە لەنێوان خەڵكەكەمدا**

**هەتا پلە و پێگەیەكی وەهام بۆ دەركەوت كە نە لە خەیاڵ و نە لە هزر و نە لە بیرمدا هەبوو**

## شیعری بیست و حەوت : إن كان منزلتي في الحب عندكم

إنْ كان مَنزِلَتي في الحبّ عندكُمُ

ما قد رأيتُ فقد ضيّعْتُ أيّامي

أُمْنِيّة ظفِرَتْ روحي بها زَمَناً

واليومَ أحسَبُها أضغاثَ أحلام

**ئەگەر هەموو پلە و پێگەی من لە خۆشـــەویســـتیدا لەلای ئێوە ئەوەبێت کە دیومە ، ئەوا ڕۆژگارەکانم بەفیڕۆ داوە لەپێناوتان**

**ئاوات و هیوایەک هەبوو کە ڕوحم ڕۆژانێک پێی ئالوودەبووبوو ، ئێستاش وای دەبینم کە تەنها خەونێک بوبێت**

# پێڕست

پێشەکی ........................................ 2
پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ ئیبن فارض ........................................ 3
شیعری یەکەم : أخفي الهوى و مدامعي تبديه ........................................ 5
شیعری دووەم : لم أخش و أنت ساكن أحشائي ........................................ 7
شیعری سێهەم : قد راح رسولي و كما راح أتى ........................................ 8
شیعری چوارەم : روحي للقاک یا مناها اشتاقت ........................................ 9
شیعری پێنجەم : خليلي إن جئتما منزلي ........................................ 10
شیعری شەشەم : يا ليلة وصل صبحها لم يلح ........................................ 11
شیعری حەوتەم : روحي لک يا زائر في الليل فدا ........................................ 12
شیعری هەشتەم : ما أطيب ما بتنا معا في برد ........................................ 13
شیعری نۆیەم : زدني بفرط الحب فیک تحيرا ........................................ 14
شیعری دەیەم : عيني جرحت وجنته بالنظر ........................................ 18
شیعری یانزدەهەم : ما أصنع وقد أبطأ علي الخبر ........................................ 19
شیعری دوانزدەهەم : عوذت حبيبي برب الطور ........................................ 20
شیعری سیانزدەهەم : حديثه أو حديث عنه يطربني ........................................ 21
شیعری چواردەهەم : كلفت فؤادي فيه ما لم يسع ........................................ 22
شیعری پانزدەهەم : عين نظرت إلیک ما أشرفها ........................................ 23
شیعری شانزدەهەم : أهوى قمرا له المعاني رق ........................................ 24
شیعری حەڤدەهەم : نسخت بحبي أية العشق من قبلي ........................................ 25
شیعری هەژدەهەم : إن مت وزار تربتي من أهوى ........................................ 28
شیعری نۆزدەهەم : إن جزت بحي لي على الأبرق حي ........................................ 29
شیعری بیستەم : أهوى رشأ رشيق القد حلي ........................................ 30
شیعری بیست و یەکەم : فطوفان نوح عند نوحي كأدمعي ........................................ 31
شیعری بیست و دوو : وإن يكن فرط وجدي في محبتكم ........................................ 32
شیعری بیست و سێ : ولو خطرت لي في سواک إرادة ........................................ 33

